# ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی

# سەری ساڵ

ئامادەکردنی:

**کەناڵی أقوال السلف**



مسوڵمانانی بەڕێز پێم باشە زۆر بەکورتی باسێک بکەین لەسەر شتێک کەزۆر باوە لەناو هەندێ لەموسوڵمانان و هیچ پەیوەندیشی پێمانەوە نیە:

ئەویش ئاهنگ گێڕانە بەبۆنەی سەری ساڵی زاینی ، کەوا بەقسەی خۆیان عیسا(علیه السلام) لەو ڕۆژا لەدایک بوە کەهیچ بەڵگەیەکی صەحیح نەیسەلماندوە کە لەو ڕۆژەدا لەدایکبووبێت بەڵکو ئەو ڕۆژە کۆمەڵە قەشەیەک کۆبونەوەو دیاریان کرد کە بیکەنە یادی لەدایک بونی عیسا(علیه السلم) ، وەهەر وەها ئەودارەشی کەدایان ناوە هیچ پەیوەندیەکی بەمەسیحیەتەوە نیە بەڵکو عادەتێکی کۆنی ئەڵمانیەکان بوە کە پێشتر داریان پەرستوە وەدوای کەبونەتە مەسیحی هەر داریان لا بەڕێز بوەو کردویانە بەعەلاماتێک بۆ سەری ساڵ.

## حوکمی بەژداری کردن لەو ئاهنگە:

یەکەم شت ئەو مەسیحیانەی کەتۆ بەڕوی پێدەکەنی و بەدڵ خۆشیەوە پیرۆزباییان لێدەکەیت دەبێ بزانیت کافرن و الله بەکافری داناون کەواتە تۆ پیرۆز بایت لەکافرێک کرد.

الله دەفەرمێت: {لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ}. المائدة: 72

واتە: سوێند بێت بێگومان بێ باوەڕبوون ئەوانەی کە وتیان بێگومان خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە لە کاتێکدا مەسیح(کاتێ ڕەوانە کرا) وتی ئەی نەوەی ئیسرائیل تەنها الله بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەشە بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ

ئەوە بێگومان الله بەهەشتی لێ حەرام کردووە وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت وە بۆ ئەو ستەم کارانە هیچ یارمەتی دەرێك نی یە.

وەدەفەرمێت: {لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ} المائدة: 73

واتە: سوێند بەالله بەڕاستی بێ باوەڕ بوون ئەوانەی کە وتیان بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا(کە بریتین لە پەروەردگار و عیسا و دایکی) لە کاتێکدا هیچ پەرستراوێك نی یە بێجگەلە تەنیا خوایەك وە ئەگەر واز نەهێنن لەو وتە ناڕەواو بەدانە سوێند بە الله دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کە بێ باوەڕ بوون سزایەکی بە ئازار و سەخت.

وەهەروەها دەفەرمێت: {مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٌ} المائده 75

واتە: مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ نی یە جگەلە نێراوی الله.

ئێسە بینیمان کەالله دەفەرمێت عیسا نێراوی اللّٰهیە وە نەصرانیە کافرەکانیش دەڵێن نەخێر عیسا خوایە یان یەکێکە لەسێخواکە پەنابە الله کەواتە تۆ پیرۆز بای لەکەسێک دەکەی کەدەڵێ عیسا خوایە.

هەروەها الله دەفەرمێت:

{وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا (88) لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا (89) تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ

وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا (90) أَن دَعَوْاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا (91)
وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا (92)} سورة المريم.

واته: ئەو كافرانە دەڵێن: الله كوڕی هەيە ، بەڕاستی بەم قسەيەتان خراپەيەكی زۆر گەورەتان ئەنجام دا ، خەريكە ئاسامانەكان لەت لەت ببن و زەوی كەرت بێت و شاخەكان بەتوندی بكەونە خوارەوە ، لەبەر ئەوەی كەوتيان الله مندڵی هەيە ، خۆ هەرگيز بۆ الله ناگونجێت كەمنداڵی هەبێت.

تەماشاكە تۆ دەچيت پيرۆزبای لەخاوەنی ئەوقسەيە دەكەيت كەوەختە لەتاو خراپی ئەو قسەيە ئاسمان لەت بێت و زەوی شەقبێت.

.

ئیمامی عومەر دەفەرمیت:

دوور بکەونەوە لە دوژمنانی اللە لەجەژنەکانیان چونکە لەو کاتا تورەی اللە دادەبەزێت.

[ سنن الکبری ]

وەاللە تعالی لە باسی یەکێک لەسیفەتەکانی باوەڕدار اندا دەفەرمێت:

{وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ} الفرقان 72

واتە: وە (بەندەکانی الله) کەسانێکن کە شایەتی درۆ نادەن.

کەلەتەفسیری ابن ابی حاتم هاتوە کە ابن عباس و مجاهد ضحاک و غەیری ئەوانیش فەرمویانە:

(وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ) ئەوە چەژنی موشریکەکانە.

وە ابن کثیر لەتەفسیری ئەو ئایەتە دا دەڵێ:

ابو عالية و طاوس و ابن سيرين و ضحاک و ربيع بن انس و غەیری ئەوانیش فەرمویانە ئەوە جەژنی موشریکەکانە.

وەمەعلومە لامان کەنەصرانیەکان چ موشریکێکی خەبیڤن بۆیە پێویستە دورکەوینە لەو بەناو جەژنە.

وە ابن قیم لە ( احکام اهل ذمە ) دەڵێ:

بەیەک دەنگی عولەمایان پیرۆز بایکردن لەجەژنی کافر و موشریکین حەرامە.

کەواتە پیرۆز بای کردنی حەرام بێت بێگومان بەژداری کردنیش تێیدا حەرامە.

لەکۆتایدا دەڵێم ئێمەی موسوڵ مان تەنها دوو جەژنمان هەیە ئەویش ( قوربان ، ڕەمەزان ) غەیری ئەم دوانە هیچ بۆنەو جەژنێک پەیوەندی بەئێمەوەنیە وەپێویستیشە خۆمانی لێ دوربخەینەوە.

